# 20

## بابەتی گرنگ و پوخت دەربارەی

# قوربانیکردن



سالار عومەر

# ناسنامەی کتێب

ناوی پەرتووک: ٢٠ بابەتی گرنگ و پوخت دەربارەی قوربانیکردن
ئامادەکردنی: سالار عومەر
نەخشەسازی بەرگ : ڕێدار عمر
تیراژ : ١٠٠٠ دانه .
نۆره و ساڵی چاپ: یەکەم، ١٤٤٤ کۆچی – ٢٠٢٣ ز

## پێشەکی:

خوای گەورەو میهرەبان کە بەندەیەکی خۆی قەبوڵ کرد بەهاتنە ناو بازنەی ئیمانداران، دوای ئەو قەبووڵکردنە بە هەموو جۆرێك لە جۆرەکان بەندەکانی تاقی دەکاتەوەو لە سەنگی مەحەکیان دەدات بۆ ئەوەی لە ڕۆژی تەنگانەو ڕۆژی ڕوو بەڕووبوونەوە لەگەڵ دارو دەستەی شەیتان و شەیتانییەکان، ئەو بەندە بێت کە خودا دەیەوێت.

ئەم تاقیکردنەوەش لە پێغەمبەرانەوە (علیهم الصلاة والسلام) دەستی پێکردووەو سەرەتا نێردراوانی خودا تاقی کراونەتەوەو لە سەنگی مەحەك دراون.

گەورە ترین نموونە پێغەمبەر ئیبراهیمە (علیه السلام) کە بە خۆشەویسترین و شیرینترین کەسی تاقی دەکرێتەوە کە نەوە جوان و قەشەنگەکەیەتی، کە بە فەرمانی خوا دەبێ سەر ببڕدرێ لە پێناو ڕەزامەندی خوای تاقانەدا، پێغەمبەر ئیبراهیم لە تاقیکردنەوەکەیدا سەرکەوتوو بوو وە دەرچوو..!!

ئیسلام پێویستی بە قوربانیدانە، تا لە چوارچێوەی قەتیس بوون بێتە مەیدان و لە هەموو کایەکانی ژیان دەورو کاریگەری هەبێت، ئەوەی گرنگە بزانین ئەوەیە ئایا ئێمە دەتوانین لە تاقیکردنەوەکانی خوای گەورە سەرکەوتوو بین و لەم سەردەمە پڕ لە تەکنەلۆجیاو دونیای عەولەمەدا بتوانین لەبەرامبەر ئەو تەوژمە زۆر توندو بەرنامە دارێژراوانەی شیرە مژەی شەیتانەکان بوەستین و لەم تاقیکردنەوەدا ئێمەش مەردانەو جوامێرانە سەر هەڵبڕین و ڕووسوورانە بڵێین خوای پەروەرێنمان سوپاس بۆ تۆ ئێمەش بەندە ڕاستگۆکان و ڕاستڕەوەکانی ئەم سەردەمە دەرچووین و دونیاو دونیا گەرایی نەیتوانی بەسەرماندا زاڵ بێ و پێویستە بتوانین سەربەرزانە کارتی دەرچوون وەربگرین و دڵ ڕاگر و خۆڕاگربین بەرامبەر هەموو تەوژمێکی پیس و گەنیو.

داواکارم لەپەروەردگار ئێمە و باقی موسڵمانان جێگیر و سەرکەوتوو بکات لەهەموو جۆ رە تاقیکردنەوە و پێشهاتێک... ئامین.

## جەژنی قوربان

یەکێکە لە جەژنەکانی موسوڵمانان و ئایینی ئیسلام، لە ڕۆژی ١٠ی زی الحجەی هەموو ساڵێکی کۆچی دوای تەواوبوونی ڕۆژی وەستانی عەرەفە ئەنجام دەدرێت و ماوەی چوار ڕۆژ دەخایەنێت، لەم ماوەیەدا حاجییانی ماڵی خودا هێشتا فەرزەکانی بەجێهێنانی حەجیان ماوە و فەرزەکانی حەجیان لە سێیەم ڕۆژی جەژن کۆتایی دێت.

## کاتەکەی:

ڕۆژی جەژنی قوربان دەکەوێتە دەیەمی مانگی زی الحجەی ساڵی کۆچی، ڕۆژێکی پێش دەستپێکی حەج بریتییە لە ڕۆژی عەرەفە کە دەکەوێتە نۆی مانگ و حاجییان دەڕۆنە سەر کێوی عەرەفە و ڕادەوەستن.

## چەند بابەت و پرسێکی گرنگ دەربارەی قوربانیکردن:

### بابەتی یەکەم: قوربانی کردن و حوکمەکانی

### پێناسەی قوربانیی:

قوربانیکردن بریتییە لە سەربڕینی ئاژەڵانی وەك مەڕ، بزن، ڕەشە وڵاغ (گا و مانگا) و وشتر لە جەژنی قورباندا، بە مەبەستی پەرستنی خوای گەورەو نزیککەوتنەوە لێی.

### حوکمەکەی:

موسڵمانان کۆکن لەسەر ئەوەی شەرع ڕێگەی داوە بە قوربانی کردن، و کۆمەڵەی زانایان کۆکن لەسەر ئەوەی کە سونەتێکی دووپاتکراوەیە، بە بەڵگەی فەرموودەی پێغەمبەری خۆشەویستمانﷺ کە دەفەرموێ: **(إذا رَأَيْتُمْ هِلالَ ذِي الحِجَّةِ،**

**وأَرادَ أحَدُكُمْ أنْ يُضَحِّيَ، فَلْيُمْسِكْ عن شَعْرِهِ وأَظْفارِهِ)**[١]. گەر مانگی ذي الحجەتان بینی و کەسێکتان ویستی (توانی) قوربانی بکات، با پرچی و نینۆکی نەکات.

پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ قوربانی کردنی پەیوەست کردووە بە تواناوە، و تواناش بەڵگە نییە لەسەر بە ئەرک بوون(واجب).

لە بەیهەقییەوە ئەبو بەکر و عومەڕ خوای گەورە لێیان ڕازی بێ قوربانیان ناکرد لە ترسی ئەوەی وا گومان بکرێ کە قوربانی کردن ئەرکە.

ئیبن حەزم دەڵێت:- **"لا يصح عن احد من الصحابة انها واجبة"**[٢] لە هیچ هاوەڵێکەوە نەهاتووە قوربانی کردن ئەرک بێت.

---

[١] الراوي : أم سلمة أم المؤمنين | المحدث : مسلم | المصدر : صحيح مسلم | الصفحة أو الرقم | ١٩٧٧ : خلاصة حكم المحدث: [صحيح]

[٢] المحلى (٣٥٨/٧)

## بابەتی دووەم: بۆ قوربانی کردن چوارمەرج هەیە:

١ .قوربانییەکە ئاژەڵ بێت، ئەوانیش وشتر و مانگا و مەڕو بزن، جگەلە ئەمانە نابێت.

٢ .تەمەنی دیاریکراوی شەرعی تێپەڕ کردبێت، ئەوەش دەبێت وشتر ٥ ساڵ بێت،و مانگا ٢ ساڵ بێت، و بزن ساڵێک بێت، و بەرخ ٦ مانگی تێپەڕ کرد بێت.

*گەر قوربانییەکە لە تەمەنی دیاریکراو نەبێت درووست نییە بە کۆدەنگی زانایان.

٣ .سەلامەت بێت و هیچ کەموکووڕیی و نەخۆشییەکی نەبێت.

٤. قوربانییەکە لە کاتی دیاریکراوی خۆی بێت.

## بابەتی سێیەم: مەڕبۆیەکە ووشترو مانگا بۆ حەوتە:

(عن عَطَاء بْن يَسَارٍ قال : سَأَلْتُ أَبَا أَيُّوبَ الأَنْصَارِيَّ كَيْفَ كَانَتْ الضَّحَايَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ؟ فَقَالَ : كَانَ الرَّجُلُ يُضَحِّي بِالشَّاةِ عَنْهُ وَعَنْ أَهْلِ بَيْتِهِ ، فَيَأْكُلُونَ وَيُطْعِمُونَ )[1].

لە ئەبو ئەیوبەوە خوای گەورە لێی ڕازی بێت دەفەرموێت: لە سەردەمی پێغەمبەرﷺ پیاوێک هەبوو قوربانی دەکرد بۆ خۆی و بۆ خانەوەداکەی، لێیان دەخوارد و بە خەڵکیشیان دەدا.

وە لە صەحیحی موسلیمەوە لە فەرموودەیەکی دایکە عائیشەوە خوای گەورە لێیان ڕازی بێت، دەفەرموێت: (أن رسول الله صلى الله عليه وسلم أتى بكبش، ليضحي به فأضجعه ثم ذبحه ثم قال باسم الله اللهم تقبل من محمد وآل محمد ومن أمة محمد).

---

[1] روى الترمذي (١٥٠٥)

پێغەمبەر ﷺ بەرانێکی هێنا بۆ ئەوەی بیکاتە قوربانی، بردی و پاڵیکەوان، و دواتر سەری بڕی و فەرمووی "بسم الله، خوایە لە محمد و خانەوادەی محمد و ئومەتی محمدی وەربگرە"، و لە جابرەوە خوای گەورە لێی ڕازی بێت دەفەرموێت: **(نَحَرْنَا مع رَسولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ عَامَ الحُدَيْبِيَةِ البَدَنَةَ عن سَبْعَةٍ، وَالْبَقَرَةَ عن سَبْعَةٍ.)**[١]

لە ساڵی حودەیبییە لەگەڵ نێردراوی خوا ﷺ وشترمان سەربڕی بۆ حەوت و مانگاشمان سەربڕی بۆ حەوت.

بۆ هەر ماڵێک یەک مەڕ دەبێت گەر ژمارەیشیان زۆر بێت، و گەر دوو خێزان بن لە یەک ماڵ بۆیان دەبێت، وگەر کوڕەکە جیابوو لە باوکی لە ماڵێکی سەربەخۆ ئەوا دەبێت هەریەکەیان و بەجیا بیکەن.

---

[١] الراوي : جابر بن عبدالله | المحدث : مسلم | المصدر : صحيح مسلم/ الصفحة أو الرقم | ١٣١٨ :خلاصة حكم المحدث : [صحيح]

## بابەتی چوارەم: هاوبەشی کردن لە قوربانی:

مەبەست لێی هاوبەشی کردنی خاوەن قوربانییە لەگەڵ کەسانی تر، و ئەمەش دەبێتە دوو بەشەوە:-

**یەکەم// هاوبەشی کردن لە پاداشت:**

بۆی هەیە خانەوەداکەی یان باوانی یان جگەلە ئەوان هاوبەش بکات لە مەڕ یان وشتر و مانگا، وەکو ئەوەی پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ مەڕی دەکردە قوربانی بۆ خۆی و خانەوادەکەی.

**دووەم// هاوبەشی کردن لە تێچووەکەی:**

وەکو ئەوەی تێچووی قوربانییەکە بڕە پارەیەک بێت، برایەک بە براکەی دەڵێت تۆ نیوەی بدە و منیش نیوەی دەدەم، ئەم هاوبەشی کردنە لە ماڵە دروست نییە و ڕێگە پێنەدراوە، لەبەر ئەوەی قوربانی کردن پەرستنێکی تایبەتە، و لە هیچ سەرچاوەیەکەوە

نەهاتووە پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ یان هاوەڵان هاوبەشیان کردبێت لە تێچووەکەی، هەرچەندە هاوەڵان هەژار بوون.[١]

## بابەتی پێنجەم: لە قوربانیدا مەرجە ئاژەڵەکە سەلامەت و دوور لە کەموکووڕیی بێت:

لە بەرائی کوڕی عازبەوە پێغەمبەر ئەزیزمان ﷺ دەفەرموێت: (**أربعٌ لا تجوزُ في الأضاحيِّ فقالَ العوراءُ بيِّنٌ عورُها والمريضةُ بيِّنٌ مرضُها والعرجاءُ بيِّنٌ ظلعُها والكسيرُ الَّتي لا تَنقى**)[٢]

چوار دانە نابێت بۆ قوربانی کردن؛ ئاژەڵێکی خێل یان کوێر، و ئاژەڵێکی نەخۆش(گەر لاوازی و ماندوویی یان ئارەزوو نەکردنی

---

[١] انظر رسالة الاصحية لشيخنا العثيمين ص ٥٨

[٢] صحيح أبي داود/ الصفحة أو الرقم | ٢٨٠٢ :خلاصة حكم المحدث : صحيح

خواردن و بەرزی پلەی گەرمی یان هەر نەخۆشییەکی تر)، و ئاژەڵێکی شەل، و ئاژەڵێکی ناتەواو یان شێت.

ئەو ئاژەڵانەی گوێیان یان کلکیان براوە یان شاخیان شکاوە ڕێگە پێدراوە بەڵام نابێت بکرێتە قوربانی لەبەر بوونی کەموکووڕیی تێیاندا.

**تێبینی/ کۆمەڵێك پرسیاری گرنگی کە موسڵمان پێویستە بیزانێت:**

١-حوکمی قوربانی کردن بەحەیوانێک کە گوێی بڕابێت یاخود شاخی شکابێت چی یە ؟

ئیبن عثیمین دەڵێت: دروستە ودەبێت بکرێت بەقوربانی بەڵام مەکرۆهە ؛ چونکە نەقسی هەیە وکامڵ نی یە[١] .

٢- ئایا دروستە حەیوانی خەسێنراو بکرێت بەقوربانی ؟

---

[١] مجموع الفتاوى (٢٥-٤٠)

ابن عثیمین دەڵێت: بەڵێ دروستە حەیوانی خەسێنراو بکرێت بەقوربانی تەنانەت هەندێ لەزانایان لەحەیوانی تر پێیان باشتر بووە چونکە گۆشتەکەی خۆشتر دەبێت[١].

٣-ئایا دروستە حەیوانێک بکرێت بەقوربانی کەگوێی داخ کرابێت؟

ئیبن عثیمین دەڵێت: بۆ چوونی ڕاست ئەوەیە زیانی نی یە ، جا گوێ بڕاو وشاخ شکاو وکلک بڕاو هەمویان دەشێن بۆ قوربانی بەڵام باشتر وایە نەکرێن بەقوربانی چونکە نەقسیان هەیە وکامڵ نین[٢].

---

[١] مجموع الفتاوی (٢٥-٥٠)

[٢] مجموع الفتاوی (٢٥-٥٤)

## بابەتی شەشەم: چی دەوترێت لە کاتی قوربانی کردن:

پێویستە بڵێت:- (بسم اللە، اللە اکبر)، بسم اللە کردن ئەرکە، و تەکبیر کردن سونەتە، وەکو ئەوەی لە فەرموودەکەی ئەنەسەوە لە هەردوو صەحیحی موسلیم و بوخاری هاتووە، دەفەرموێت: **(ضَحَّى النَّبِيُّ ﷺ بِكَبْشَيْنِ أَمْلَحَيْنِ أَقْرَنَيْنِ ذَبَحَهُمَا بِيَدِهِ، وَسَمَّى وَكَبَّرَ وَوَضَعَ رِجْلَهُ عَلَى صِفَاحِهِمَا)** پێغەمبەر ﷺ دوو بەرانی سپی تێکەڵ بە ڕەشی کردە قوربانی، بە دەستی خۆی سەریانی بڕی، و بسم اللە و تەکبیری کرد، و پێیشی خستە سەر لاکانیان.

باشتر وایە لە کاتی قوربانییەکە داوای وەرگرتنی بکرێت، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی کە لە خاڵی سێیەم هاتووە.

پێغەمبەر ﷺ بەرانێکی هێنا بۆ ئەوەی بیکاتە قوربانی، بردی و پاڵیکەوان، و دواتر سەری بڕی و فەرمووی "بسم اللە، خوایە لە محمد و خانەوادەی محمد و ئومەتی محمدی وەریبگرە."

باشتر وایە خاوەنی قوربانییەکە سەرپەرشتی سەربڕینەکە بکات، جا گەر ئافرەت بێت یان پیاو، لەبەر ئەو کارەی کە پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ ئەنجامیداوە لە فەرموودەی پێشوودا، گەر نەیتوانی بە کەسێکی تری دەسپێرێت بەڵام خۆی سەرپەرشتی بکات لە پێشترە.

## بابەتی حەفتەم: کاتی سەربڕینی قوربانییەکە:

### ١-کاتی دەستپێکردنی قوربانیی:

کاتی سەربڕینی قوربانییەکە لە دوای نوێژی جەژن دەست پێدەکات، بە بەڵگەی ئەوەی لە هەردوو صەحیحی موسلیم و بوخاریدا هاتووە لە فەرموودەکەی بەڕائی کوڕی عازبدا کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: **(إنَّ أوَّلَ ما نَبْدَأُ به في يَومِنا هذا أنْ نُصَلِّيَ، ثُمَّ نَرْجِعَ، فَنَنْحَرَ، فمَن فَعَلَ ذلكَ فقَدْ أصابَ سُنَّتَنا، ومَن ذَبَحَ قَبْلَ أنْ يُصَلِّيَ فإنَّما هو لَحْمٌ عَجَّلَهُ لأهْلِه، ليسَ مِنَ النُّسُكِ في )**[1]

لە پێشترین شت کە لە ئەم ڕۆژەدا دەستی پێبکەین ئەوەیە نوێژ بکەین، دواتر بگەڕێینەوە سەربڕین بکەین، هەر کەسێک

---

[1] التخريج : أخرجه البخاري (٩٦٨)، ومسلم (١٩٦١)

ئەنجامیدا ئەوا سونەتی ئێمەی پێکاوە، و هەر کەسێک پێشتر سەربڕین بکات ئەوا گوشتێکە و پێشکەشی خانەوادەکەی کردووە، هیچ شتێک نەکردووە لە پەرستن.

**٢-کاتی تەواوبوونی قوربانیکردن:**

کاتی قوربانی کۆتایی دێت بە خۆرئاوابوونی سێیەم ڕۆژی تەشریق، و بە پێی ئەمە ڕۆژانی قوربانی چوار ڕۆژە، ڕۆژی جەژن و سێ ڕۆژی دوایی، و ئەمەش هەڵبژاردەی شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیەیە.

وە سونەت وایە (بۆ هەر کەسێک پێی کرا) قوربانیەکەی نزیک نوێژگەی جەژن بکات، بە پێی ئەوەی کە ئیبن عومەر گێڕاویەتییەوە، دەفەرموێت: **(أن رسولَ اللهِ -ﷺ- كانَ يَذْبَحُ ، أو**

**يَنْحَرُ بالمُصَلَّى)**[١]. "پێغەمبەر ﷺ سەربڕینی دەکرد لە نوێژگە."
{نوێژگە مەبەست لێی مزگەوت نییە، شوێنێکە دیاری دەکرێت و نوێژی جەژنی تێدا ئەنجام دەدرێت}.

## بابەتی هەشتەم: ئەگەر پێش جەژن قوربانی بکرێت حوکمی چیە؟

ئیبن عثیمین دەڵێت:
أ- گەر پێش نویژی جەژن قوربانی کرد ئەوا بەقوربانی ئەژمار ناکرێت وپێویستە لەبری ئەوە حەیوانێکی تر بکاتە قوربانی.
ب- وەگەر دوای ئاوا بوونی خۆری چوارەم ڕۆژی جەژن قوربانی کرد ئەوا بەقوربانی ئەژمار ناکرێت مەگەر عوزری هەبێت[٢].

---

[١] المصدر : صحيح النسائي | الصفحة أو الرقم | ٤٣٧٨ : خلاصة حكم المحدث :صحيح |التخريج : أخرجه النسائي (١٥٨٩) واللفظ له، وأخرجه البخاري (٥٥٥٢) باختلاف يسير

[٢] مجموع الفتاوى (٢٥-١٢)

## بابەتی نۆیەم: ئایا دروستە کرێی قەسابەکە بدرێت لە قوربانییەکە؟

بە کۆدەنگی زانایان نابێت کرێی قەسابەکە بدرێت لە قوربانییەکە، وەکو ئەوەی خاوەن قوربانییەکە بە قەسابەکە بڵێت ئەم ئاژەڵەم بۆ سەربڕە بە ئەوەندە پارەیە و من لە بری پارەکە گۆشتت پێ دەدەم، بە ئەمەش لە ئەو شتەی فرۆشتووە کە پێی نزیک دەبێتەوە لە خوای گەورە، و پێغەمبەر ﷺ نەهی کردووە لە ئەم شتە، بە بەڵگەی ئەوەی هاتووە لە هەردوو صەحیحی موسلیم و بوخاری، ئیبن هەبیرە دەفەرموێت: **(واتفقوا على أنه لا يعطي ذابحها بأجرته شيئا منها، لا من الجلد ولا من اللحم)**

"ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی هیچ شتێک لە سەربڕاوەکە نەدرێت بە سەربڕەکە، نە لە پێستەکەی و نە لە گۆشتەکەی."

وە دەشکرێت وەکو خێرێک بدرێت بە قەسابەکە گەر هەژار بوو، وە وەکو دیارییەک گەر دەوڵەمەند بوو.

## بابەتی دەیەم: ئایا سونەتە قوربانی بکرێت بۆ مردوو؟

ئیبن عوثەیمین دەفەرموێت: سونەتە بۆ زیندووەکان، و سونەت نییە بۆ مردووەکان، و هیچ شتێک لە پێغەمبەرەوە ﷺ ڕوون نەکراوەتەوە بۆ مردووەکانی، نە لە خەدیجەی هاوسەری کە خۆشەویسترین ئافرەت بووە لەلای، نە لە حەمزەی مامی کە خۆشەویسترین مامەی بووە، نە هیچ یەکێک لە منداڵەکانی کە بەشێک بوونە لە ئەو، بەڵکو قوربانی کردووە بۆ خۆی و خانەوادەکەی.

**وە لە نامەی قوربانیدا " لاپەڕە ٥١ " دەفەرموێت:**

قوربانی کردن بۆ مردوو سێ بەشە؛

**بەشی یەکەم:** لەگەڵ زیندووەکان بێت، وەکو ئەوەی کەسێک قوربانییەک بۆ خۆی خانەوادەکەی بکات و مردووی هەبێت، پێغەمبەر ﷺ قوربانی دەکرد ە دەیفەرموو: ( اللهم هذا محمد وآل محمد) خوایە ئەمە لە محمد و خانەوادەی محمدە.

وە تیای بوو کە پێشتر مردبوون.

**بەشی دووەم:** قوربانی بکرێت بۆ مردوو بە خۆبەخشانە، وەکو ئەوەی موسڵمانێک خۆبەخشانە قوربانی بکات بۆ مردوویەک، فەقێ حەنبەلییەکان لەگەڵ ئەوەن کە ئەمە خێر و پاداشتەکەی دەگات بە مردووەکە و سوودی لێ دەبینێت، بە پێوەرەی ئەوەی خێری لە جیاتی بکرێت، و کۆمەڵێک لە زانایان لەگەڵ ئەوەن قوربانی ناکرێت بۆ مردوو مەگەر وەسێتی کردبێت.

**بەشی سێیەم:** قوربانی بکرێت بۆ مردوو بە پێی وەسێتی خۆی، وەکو جێبەجێ کردنی بۆ وەسیەتەکەی، وەکو ئەوەی وەسێتی کردووە جێبەجێ دەکرێت بەبێ زیاد کردن و کەم کردن.

**بابەتی یازدەیەم: هەر کەسێک ویستی قوربانی بکات لە دە ڕۆژەکەدا(دە ڕۆژی سەرەتای مانگی ذي الحیجه) هیچ شتێک لانەدات لە پرچ و نینۆک و پێستی[١] تا ئەو کاتەی قوربانییەکەی سەر دەبڕێت.**

بە پێی فەرموودەی پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ: **(إذا رَأَيْتُمْ هِلالَ ذِي الحِجَّةِ، وأَرادَ أحَدُكُمْ أنْ يُضَحِّيَ، فَلْيُمْسِكْ عن شَعْرِهِ وأَظْفارِهِ)[٢].**

گەر مانگی ذي الحجەتان بینی و کەسێکتان ویستی (توانی) قوربانی بکات، با پرچی و نینۆکی نەکات.

---

[١] ابن عثيمين دەڵێت: مەبەست لەپێست ، ئەوەیە کەهەندێ کەس بەشێک لەپیستی پاژنە پێی لێ دەکاتەوە. مجموع الفتاوى (٢٥-١٣٩)

[٢] الراوي : أم سلمة أم المؤمنين | المحدث : مسلم | المصدر : صحيح مسلم | الصفحة أو الرقم | ١٩٧٧ : خلاصة حكم المحدث : [صحيح]

## بابەتی دوازدەیەم: گەر کەسێك کرا بەوەکیل مەرجە موو نینۆکی نەکات؟

گەر کەسێك کرا وەکیل بۆ قوربانیکردن یان کەسێك وەسیەتی کردبوو دوای مردنی قوربانی بۆبکەن، ئەوە لەسەر ئەو وەکیلە پێویست نییە نینۆک و مووی لەشەی لەنەدات و ئاساییە لایبدات، چونکە قوربانییەکە پەیوەست نییە بەئەو و هی کەسێکی ترە.

## بابەتی سێزدەیەم: ئایا دروستە قوربانی بدەیتە کەسێک کە باوەڕی بە ئیسلام نەبێت؟

زانایان دەڵێن گەر ئەو کەسەی باوەڕی بە ئایینی ئیسلام نییە و ئایینێکی دیکەی هەیە، دراوسێیەکی بێ زیان یاخود خزمێکی بێ زیان بێت و هیچ دژایەتییەکی ئایینەکە نەکات و دوژمنی نەبێت و لە دژی نەوەستێتەوە ئەوە جائیزە و ڕێگەپێدراوە قوربانی پێ بدرێت.

ئیبن قدامە ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویت : دروستە بدەیتە کافر چونکە خێری سوننەتە، دروستە بدەیت بەو کافرەی کە لەگەڵ موسلمانان دەژیت وەک هەموو خێرەکانی تر.

ئیبن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویت :دروستە مرۆڤ گۆشتی قوربانی بدات بە کافر بەمەرجێک ئەو کافرە لەوانە نەبێت شەڕ دژی موسلمانان بکات ، ئەگەر شەڕ بکات هیچی پێ نادرێ.

ئیبن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویت : کافر ئەوەی لە نێوان ئێمە و ئەو جەنگ نییە وەک مستأمن و معاهد لە قوربانی پێی دەدرێ و لە صەدەقەش.

## بابەتی چواردە: چۆن گۆشتی قوربانی دابەش بکەین؟

ئیبن باز دەڵێت: سوننەتە ئەو کەسەی کەقوربانی دەکات:

أ- لێی بخوات.

ب- وەک هدیە بەشی خزمەکانی ودراوسێکانی لێ بدات.

ج- وە هەندێکی بکات بەخێر[١].

**ئیبن عثیمین دەڵێت:**

١-مرۆڤ لێی دەخوات.

٢ -هەندێکی وەک خێر دەدات بەهەژاران.

٣ -هەندێکی وەک هەدیە دەدات بەکەسانی دەوڵەمەند وەک ڕاگرتنی دڵیان وزیاتر خۆشەویستی لەنێوانیاندا[٢].

---

[١] مجموع الفتاوى (١٨-٣٨)

[٢] مجموع الفتاوى (٢٥-١٤)

## بابەتی پازدە: حیکمەت لەدابەش کردنی گۆشتی قوربانی چی یە ؟

ئیبن عثیمین دەڵێت: بۆ ئەوەی سێ مەبەستی شەرعی وەدەست بێت لەقوربانی کردندا:

یەکەم : چێژ وەرگرتن لەنیعمەتی خودا ئەوەش بەخواردن لێی.

دووەم : ئومێد بوون بەپاداشتی خودا ئەوەش بە بەخشینی بەهەژاران.

چوارەم : خۆشەویستی لەنێو بەندەکانی خودادا ئەوەش بەبەخشینی بەهەدیە بەخزم وبرادەران[١].

---

[١] مجموع الفتاوى (٢٥-١٤).

## بابەتی شازدە: حوکمی کردنە خێری پارەی قوربانی ؟

ئیبن باز دەڵێت:

أ- گەر قوربانیەکە دیاری کرابێت جا بەوەقف بێت یاخود وەسیەت ئەوا دروست نی یە بۆ کەسی وەکیل لێی لابدات ولەبری قوربانی کردن پارەکەی بکات بەخێر.

ب-گەر قوربانی سوننەت بێت وبۆ غەیری خۆی بکات ئەوا بەر فراوانە ودەتوانێت.

ج- حەتمەن حەیوان کردنە قوربانی لەکردنە خێری پارەکەی باشترە[1].

---

[1] مجموع الفتاوى (١٨-٤١)

**بابەتی حەڤدە: -ئایا دروستە بەشێک لەگۆشت وچەوری وياخود پێستی قوربانی بفرۆشرێت ؟**

ئیبن عثیمین دەڵێت:

حەڕامە بەشێک لەگۆشت وچەوری وياخود پێستی قوربانی بفرۆشرێت ؛ چونکە ئەوا ماڵێک بۆ خودا دەرکراوە ونابێت لێی پاشگەز بیتەوە وهەروەک خێر کردن وایە ، واتە : چۆن دروست نی یە کاتێ خێرێک دەکەی بەشیمان بیتەوە بەهەمان شێوە دروست نی یە گۆشتی قوربانی بفرۆشرێت[١] .

[١] مجموع الفتاوى (٢٥-١٦١)

## بابەتی هەژدە: حوکمی قوربانی چی یە بۆکەسێک لەتوانایدا هەبێت قوربانی بکات ؟

ئیبن باز دەڵێت: سوننەتێکی موئەکەدەیە وهەریەک لەپیاو وئافرەت دەتوانن قوربانی بکەن بۆ خۆیان وماڵ ومنداڵیان .[١]

ئیبن عثیمین دەڵێت: قوربانی سوننەتێکی موئەکەدەیە بۆ کەسێک لەتوانایدا هەبێت ، مرۆڤ قوربانی بۆ خۆی ماڵ ومنداڵی دەکات[٢].

بەڵام بۆچونی تەواو ئەوەیە کە : هەرکەسێک دەستی بڕوات و توانای هەبێ واجبە لەسەری .

---

[١] مجموع الفتاوى (١٨-٣٨)

[٢] مجموع الفتاوى (٢٥-١٠)

**بابەتی نۆزدە: پیاوێک دوو ژنی هەیە دانەیەکیان لای خۆیەتی ئەوی تریان لای ماڵ باوکیەتی ئایا پێویستە لەسەری یەک قوربانی بکات یاخود دوان ؟**

ئیبن عثیمین دەڵێت: یەک قوربانی بەسە چونکە خێزانەکەی کەلەلای ماڵ باوکیەتی هەر خێزانی ئەمە با لای ماڵ باوکیشی بێت [١].

---

[١] مجموع الفتاوى (٢٥-٤٣)

## بابەتی بیست: گەر باوک چەن منالێکی هەبێت وهەندێکیان ژنیان هێنابێ ئایا قوربانیەکەی باوکیان بۆ منداڵەکانیش دەبێت لەکاتێکدا هەندێکیان ژنیان هێناوە ؟

ابن عثيمين دەڵێت:

أ- گەر یەک خێزان بن ولەیەک ماڵدا بن ئەوا یەک قوربانی بەسیانە.

ب-بەڵام گەر منداڵەکان هەریەکەیان ماڵی سەربەخۆی خۆی هەبێت ئەوا پێویستە هەریەکەیان قوربانی بۆ خۆی بکات وئەوەی باوکی بۆ ئەوان نابێت[1].

---

[1] مجموع الفتاوى (٢٥-٤١)

***چەند ئاگادارییەک پەیوەست بە قوربانی کردن:**

_ئەگەر قوربانیکەر بە مەبەست لە نینۆک و پرچ و پێستی برد بە بێ هیچ هۆیەک ئەوە پێچەوانەی نەهیکراوی کردووە، و دەبێت پەیوەست بێت بە نەکردنی نینۆک و پرچ و پێستییەوە، و ئەمەش کاریگەری نەکاتە سەر درووستی قوربانییەکەی.

_ئەوەی پرچ و نینۆکی نەکات قوربانیکەرەکەیە(خاوەن قوربانییەکە)، گەر خۆی قوربانییەکە بکات یان کەسێکی تری سپاردبێت، و ئەوە ڕاست نییە کە هەندێ لە خەڵکی وا دەزانن گەر کەسێ تری سپارد بۆ قوربانییەکە ئەوا دەتوانێت خۆی نەگرێتەوە لە ئەو شتانە.

_خۆ گرتنەوە لە پرچ کردن و نینۆک کردن تەنها بۆ خاوەن قوربانییەکەیە نەک بۆ ئەو کەسانەش کە هاوبەش کراون لە پاداشتەکەی، لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ قوربانی کرد بۆ خۆی و خانەوادەکەی و لە هیچ سەرچاوەیەکیشەوە نەهاتووە کە فرمانی بە خانەوادەکەی کردبێت خۆیان بگرنەوە.

_گەر کەسێک پێویست بوو لە پرچەکەی یان یان نینۆکی یان پێستی ببات بەهۆی برینێکەوە ئەوا هیچی لەسەر نییە ئەوەی پێویستە بیبات لە ئەوەی زیانی پێ دەگەیەنێت.

_گەر کەسێک نیازی قوربانی کردنی نەبێت بەهۆی کەمی پارە یان هەر هۆکارێکی تر و لە ماوەی دە ڕۆژەکە هۆکارەکەی نەما و نیازی قوربانی کردنی هێنا، لە ئەو کاتەوە خۆی دەگرێتەوە کە نیازی هێناوە گەر پێش دە ڕۆژەکەش نیازی نەبوو بێت.

_گەر کەسێک ویستی حەج بکات لە ئەو کاتەوە خۆی ناگرێتەوە کە قوربانیکەر خۆی دەگرێتەوە بەڵکو لە ئەو کاتەوە خۆی دەگرێتەوە لە قەدەغەکراوەکانی ئیحرام کە ئیحرام دەبەستێت لە حەج یان عەمرە.

_ڕێگە پێدراوە قەرز بکرێت بۆ قوربانی گەر توانا هەبێت بە ماوەیەکی نزیک بدرێتەوە.

_سوننەت وەهایە لە کەسێک زیاتر قوربانی نەکات بۆ خانەوادەکە، وەکو شوێنکەوتنێک بۆ پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ.

## کۆتا وتە:

-گەورەی پێغەمبەران (علیه السلام) بە قوربانیدان بە خۆشەویسترین کەسی تاقیکرایەوە، کە ڕۆڵە شیرینەکەی بوو، دەبێت ئێمەش بە شیرین ترین بوونی خۆمان قوربانی بدەین کە رۆح و ژینمانە.

-جەژنی قوربان نوێکردنەوەی یەکتاپەرستی و بەندایەتی خوای تاك و تەنهایە لە بەندایەتی پەرستش و حوکم و فەرمان ڕەواییدا.

-جەژنی قوربان بەخشینی ماڵ و ڕژانی خوێنە لە پێناوی وشەی تەوحیدو بەرز بوونەوەی وشەی الله.

ئێمەی موسڵمان پێویستە ئەم دروشمە بەبەرزی ڕابگرین و باکمان بەقسە و کرداری هیچ کەس نەبێت کە بۆ دژایەتی ئەم دروشمە مەزنە دەیکەن.

**داواکارم خوای پەروەردگار ئەم هەوڵەشمان بۆ بخاتە سەر تەرازووی چاکەکانمان**

-سوود وەرگیراوە لە نامیلکەی ( د. عبدالله بن حمود الفريح)

سوپاس بۆ هەموو ئەوکەسانەی هاوکارن لە ئامادەکردنی نووسینەکان.

٢٠ بابەتی گرنگ و پوخت دەربارەی قوربانیکردن.... .......... ...... ....................

## بەرهەمەکانی نووسەر:

١- ژیانی دووەمی مرۆڤ

٢- پێگەی دایک و باوک لەم سەردەمە.

٣- ڤالانتاین لەنێوان ڕاستی و چەواشە.

٤- فیستیڤاڵی ڕەنگەکان ( **holi**).

٥- دەریایەکی بێ کەنار .

٦- هاڵۆوین جەژنی دەرەمۆک و ترسنۆکەکان.

٧-وشەکانم دەنگیان نایە.

٨-شاری زینا ( **pompeii**)

٩-یۆگا لەنێوان (وەرزش، فەلسەفە، ئایینەدا)

١٠- پایەکانی ئیسلام و ئیمان بۆمنداڵان و نەوجەوانان.

١١- ئادابی ئیسلامی جوان بۆ منداڵان و بەوجەوان.

١٢- بیست پرسیار لەلایەن منداڵان وەڵامیان لەپێغەمبەری خودا.

# 20

## بابەتی گرنگ و پوخت دەربارەی

# قوربانیکردن



چاپی یەکەم......................... 2023